بەشی —— سێیەم

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ

باشترینتان ئەو کەسەیە کەخۆی فێری قورئان دەکات وەخەڵکیش فێردەکات



# چۆنیەتی فێربوونی

# قورئان خوێندنەوە



چاپی: ٢

## بەشی یاساکان



بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

**وبه نستعين وعليه نتوكل والصلاة والسلام على من بعث رحمة للعالمين وعلى آله وصحبه أجمعين أما بعد.**

پشتیوان بەخوا لەم بەشەیاندا :
باسێکی گرنگی چەند یاسایەك دەكەین كە زۆر گرنگە بۆ ئەو كەسانەی پێش نوێژی یاخود قورئان لە كۆڕو كۆبونەوەكان دەخوێنن،تاکە مەرج بۆ فێربوون لەگەڵ ئێمە زانینی زمانی كوردیە،وە پێش ئەم بەشە خوێنكار پێویستە لەسەری كە بەشی یەكەم و دووەمی بەتەواوی شارەزابێ تا كێشەی بۆ دروست نەكات لەكاتی خوێندنەوەی قورئان وە لەم بەشەدا خوێنكار هاندەداین كە بەشێوازی جوان(تەجوید) قورئان بخوێنێتەوە ، داواكارم لە خودای پەروردگار دامەزراومان بكات لەسەر بیرۆباوەڕی ڕاست دورستی ئیسلام تا وەكو مردن وە پاشان لەسەری حەشرمان بكات لەگەڵ پێغەمبەران و پیاوچاكان و پێشەوایانی ئوممەت و زایانی ڕەسەنی ئیسلام.

**والحمد لله رب العالمين**

**ئامادەكردنی :سەلمان عبدالله قادر**

**٠٧٥٠ ٢٤٢ ٢٥٨٢**

**( پێداچوونەوەی بەشێك لە پسپۆڕان)**

# پێش دەسپێک خاڵی ١

چۆنیەتی ڕاهێنان کردن لەسەر پیتەکان :

ء ب ت ث ج

ح خ ذ ر ك

ل م

ز
د
س
ش

= ئە

ص ض ط ظ ع

غ ف ق ن ه

و ى

# پێش دەسپێک خاڵی ٢

میخنگە:-دەنگێکە لە لوت دەردەچێ،لەگەڵ پیتی (م -ن) دایە ،

چوار ئاستی هەیە:

- لەگەڵ دووانە(شد) (مّ-نّ) وە پێ دەوترێت مینگە کاملترین و تەواوترین. نموونە :( عَمَّ ،إِنَّ ، مُحَمَّدً ، إِنَّه ).

- لەگەڵ پیتی (م-ن) شاراوە دێ پی دەوترێت مینگە تەواو

تێبینی : ئەم خاڵە لەدەرسەکانی داهاتوو ڕوونتر باسی دەکەین.

- لەگەڵ سکون (خودی پیت)دا هات (مْ-نْ) وە پێ دەوترێت ناتەواو جا لە کۆتایی بێت یان ناوەڕاست  مینگەی
نموونە:(نَسْتَعِينُ ، عَلَيْهِمْ )
ئەگەر لە کۆتا وشەدا هات دەبێت بە جوانی دەربخرێت.

- لەگەڵ فتح و کسر و ضمە دا هات (مَ-نَ) ، (مِ-نِ ) ، (مُ-نُ)

وە پێ دەوترێت  مینگە ناتەواوترین وەك پیتەکانی تریش بەهەمان شێوە.

# شێوەکانی نونی سکون لە قورئاندا




تێبینی : شێوەکانی نونی سکون لە قورئاندا کاتێك دەگەن بە إِظهار و إدغام و إقلاب و إخفاء.

# وانەی یەکەم

## دەرخستن (إِظهار)

هەرکاتێك **نونی زەنەدار** (النون الساكنە) گەیشت بە پیتی




**نونی زەنەدارەکە** (النون الساكنە) بە جوانی دەرەخەین

جا لە یەك وشەدا هاتبێت یاخود دوو وشە زیاتر.

نْ + (ء ، ه ، ع ، غ ، ح ، خ) = نْ نونەکە دەردەخەین + مینگەی ناتەواو

نمونە:

١- مَنْ ءَامَنَ ٢- مِنْهُمْ

٣- أَنْعَمْتَ ٤- مَنْ غُلَّ

٥- مَنْ حَادَ ٦- مِنْ خَيْرٍ

# وانەی دووەم

## (إِدغام) تێکهەڵکێشکردن

هەرکاتێك نونی زەنەدار (النون الساكنه) گەیشت بە پیتی ( م ، ن ، و ، ی ، ر ، ل ) پیتە نونەکە تێکەڵ بە پیتی ( م ، ن ، و ، ی ، ر ، ل ) بە پێی ئاستی مینگەکەی وەك ئەم بازنانەی خوارەوەیە :



# وانەی سێ یەم

## هەڵگەڕانەوە (إِقلاب)

هەرکاتێك نونی زەنەدار (النون الساكنه) گەیشت بە پیتی

ب نونە زەنەدارەکە دەبێتە بە پیتی (م) جا لەیەك وشە هاتبێت یاخود دوو وشە.

نْ + ب = نونەکە دەبێت بە ( م )

نمونە: مِنْ بَعْدِ

میمّبە عدی

# وانەی چوارەم

## (إِخفاء) شاردنەوە

الإخفاء (شاردنەوە )هەرکاتێك نونی زەنەدار (النون الساكنه) گەیشت بە پیتی (د، ت، ط، ث، ج، ذ ، ز ، ش ، س ، ف ، ص ، ض ) پیتە نونەکە دەشارینەوە وە ئاستی مینگەکەی ڕەچاوی پیتی دوای نونەزەنەدارەکە(النون الساكنه)دەکەین.

### مینگەی کەم

| |
|---|
| ١- ت<br>جَنَّتٌ تَجْرِى<br>جەنناتون تەجری |
| ٢- ط<br>عَن طَبَقٍ<br>عن طەبەقین |
| ٣- د<br>عِنْدَ رَبِّهِمْ<br>عیندە ڕەببیهیم |
| ١٠- ظ<br>فَلْيَنظُرْ<br>فەلیەن ظوڕ |

### مینگەی زۆر

| |
|---|
| ١- ق<br>أَنْقَضَ<br>ئەن قەضە |
| ٢- ك<br>إِنْ كَذَّبَ<br>ئین کەذذەبە |

### مینگەی مام ناوەند

| | |
|---|---|
| ١- ث<br>مَن ثَقُلَتْ<br>مەن ثەقولەت | |
| ٢- ج<br>تُنجِكُمْ<br>تون جیکوم | |
| ٣- ذ<br>فَأَنذَرْتُكُمْ<br>فەئەن ذەڕ توکوم | |
| ٤- ز<br>أَنْزَلْنَهُ<br>ئەنزەلناهو | ٧- ش<br>أَنْشَرَهُ<br>ئەنشەڕەهو |
| ٥- س<br>قيلاً سَلَـماً<br>قیلەن سلاما | ٨- ف<br>تَنْفِرُو<br>تەنفوڕوو |
| ٦- د<br>وَكَأْسًا دِهَاقاً<br>وکئسەن دیهاقا | ٩- ض<br>مِنْ ضَرِيعٍ<br>مین ضریيعن |

# وانەی پێنجەم

## سیفەتی پیتەکان

لەزمانی عەرەبیدا هەر پیت ێك سیفەتی تایبەت بەخۆی هەیە،

پیت هەیە لە سیفەتێك زیاتری هەیە،لەکاتی نیشانەی زەنە(سكون)

لەسەربیت جوانتر دەردەکەویت،وە دابەش دەبێت بەسەر دووجۆر:

**أ-سیفەتی دژدارەکان**

**ب-سیفەتی بێ دژەکان**

## أ- سیفەتی دژدارەکان

أ-شاراوە(همس):-

بریتیە لە دەرچوونی هەناسە بە بەردەوامی لەکاتی وتی پیتەکە،

لە ١٠ پیت پێك دێت،(فحدثه شخص سكت)

نموونە: (أَسْكُنْ).

ب-ئاشكرا(جهر):-

بريتيه لە دەرنەچوونی هەناسە بە بەردەوامی لەکاتی وتی پیتەکە،لە ١٨ پیت پێك دێت- ،(بێ جگە لەمانەی سەرەوە)

نموونە : (شَأْنٌ).

## ب- سیفەتی نەرمی و تەند و ناوند

أ-توندی (شدّه):-

گرتنی دەنگ لەکاتی ڕۆشتنی دەنگی پیتەکە یان دەنگ زۆر بە خێرای دەوترێ و دەرچەکە دادەخری لەکاتی وتنی پیتەکە لە ٨ پیت پێك دێت، (أجد قط بكت)

نموونە : (شَأْنٌ).

ب-نەرمی و ناسکی(رخاوة):-

نەرمی و ناسکی(رخاوة):-ڕۆشتنی بەردەوامی دەنگ لەکاتی وتنی پیتەکە،لە ١٦ پیت پیك دیت، (ح-خ-ذ-ز-ث-س-ش-ا-ض-و-غ-ف-ه-ي-ظ) نموونە : (ٱسْكُنْ).

ج-ناوەندی(الاوسط):-

ماوەی دەنگ لەکاتی وتنی پیتەکە ،ناوەند لە نێوان توندی و نەرمی،لە ٥ پیت پێك دیت، (لن عمر) .

نموونە : (يَعْمَلْ).

## 3- سیفەتی بەرز و نزمی

أ-بەرزی(الاستعلاء):-

بەرزکردنەوەی بەشی پشتەوەی زمانە بەرەو لای مەلاشوو لەکاتی وتنی پیتەکە ، لە ٧ پیت پێك دیت(خص ضغط قظ) نموونە :(أَخْلُدَ ، خَالِدِنَ ).

تێبینی : لەدوای پیتە بەرزەکان بزوێنی درێژ هات بزوێنە درێژەکە قەڵەو دەکرێ بەڵام بەئەندازەی خۆی.

ب-نزمی(الاستفال) :

نزمکردنەوەی زمان بۆناو بەشی خوارەوە (چاڵایی)لەکاتی وتنی پیتەکە ،لە ٢١ پیت پێك دیت(بێ جگە لە ٧ پیتەکەی سەرەوە)

نموونە : (ٱسْكُنْ).

## 4- سیفەتی لکاو و کراوە

### أ-لکاو(الإِطباق):-

پێوەلکانی هەموو یان بەشێکی کۆتای زمان بە مەلاشوو لە کاتی وتنی پیتەکە،لە ٤ پیت پێکدێت،(ص،ض،ط،ظ) نموونە: (أُطْلُبِ).

### ب-کراوە(الانفتاح):

بوونی بۆشایی لە نێوان زمان و مەلاشوو لە کاتی وتنی پیتەکە ،لە ٢٤ پیت پێك دیت(بێ جگە لە ٤ پیتەکەی سەرەوە).

## 5- سیفەتی تیژ(الاذلاق)و بێ دەنگ(الاصمات)

ئەم دوو سیفەتە پەیوەندیان بە تەجویدەوە نیە ،پەیوەندیان بە زانستی وشە سازیەوە (علم الصرف) هەیە.

# ب- سیفەتی بێ دژەکان

له ٧ سیفەت پێك دیت:

١- فیكه(الصفير):-

دەنگێکی تیژە لە کاتی وتنی پیتەکە لە ٣ پیت پێك دێت- (ص ،ز، س).

- فیکەی (ص) بەهێزترینە جونکە سیفەتی(بەرزی و لکاو) هەیە
نموونه : (أَصْلِي).

- فیکەی(ز) مامناوەندە لەبەر ئەوەی سیفەتی(ئاشکرای)هەیە
نموونه : (اْلزَّيْتُونِ) .

- فیکەی (س)لاوازە لەبەر ئەوەی سیفەتی (شاراوەی)هەیە
نموونه :(اَسْكُنْ).

٢-سیفەتی نەرم و ناسك(اللين):-

زۆر بەئاسانی دەوترین بێ پاڵە پەستۆکردنە سەر زمان، لە٢ پیت پێك دێت(وْ-يْ) نموونه : (بَيْتُ ، خَوْفٍ ) .

٣- سیفەتی لادەرەکان(الانحراف):-

لادانی دەنگ لە ڕۆشتن بەرەو دەرچەی جگە لە خۆی،لە ٢ پیت پێك دێت(ل ،ر) .

٤-سیفەتی دووبارببووەکان(التكرير):

لەراندنەوەی سەری زمان لەکاتی دەربرینی پیتەکە(یەك پیتی هەیە (ر) ) نموونە : ( أَرْنَبُ ، ٱلرَّحۡمَٰنُ ) .

تێبینی:- لاراندنەوەکەی نابی لە ٢ کەمتر بێ لە ٣ زیاتر بێت.

٥-سیفەتی بڵاوبونەوە(التفشي):

بڵاوبونەوە هی زۆرێك لە هەوا و دەم دا،یەك پیت پێك دێت (ش) نموونە : ( أَشْتَاتًا) .

٦- درێژبوونەوە(الاستطالة):

درێژبوونەوەی دەنگی پیتەکە لە کاتی وتنی یان پاڵنانی پیتەکە بە هێواشی لە کاتی وتنی پیتەکە یەك پیت پێك دێت (ض) نموونە : (أَضْ ، ٱضْرِب ) .

٧-سیفەتی لەرینەوە یان هەژان(القلقلة):

لەرینەوەی پیت لەکاتی وتنی بە زەنەدار(السكون) لە(٥) پیت پێك دێت = (قطب جد) ئەویش دوو جۆرە:

١-لەرینەوەی بچووك :-کاتێك لە ناوەڕاستی وەشەیەك دا دێت نموونە :(يَجْلِسُ).

٢-لەرینەوەی گەورە :-کاتێك لەکۆتایی وەشەیەك دا دێت نموونە :(لَهَبْ).

تێبینی:ئەگەر کۆتا پیت نیشانەکەی دوانە(شدە)بوو هەر لەرینەوەی گەورەیە نموونە:(وَتَبَّ).

# وانەی شەشەم

## النَّبره

نەبڕە: پاڵەپەستۆ کردنە سەر پیتێك .

١ – کاتێك پیتی کۆتایی بەدوانە (شد) کۆتایی هاتبێ

نمونە:

حَيُّ – لەکاتی ڕاوەستان پاڵە پەستۆ دەخەینە سەر پیتی (ی)حەی.

تێبینی بۆ خاڵی یەکەم:

أ - پیتی ( مّ یان نّ ) کاتێك لە کۆتایی وشەدا هاتن نەبڕە تێدا ڕوونادات.

ب – پیتی قەلقەلە (قُطْبُ جَدْ) کاتێك لە کۆتایی وشەدا هاتن نەبڕە تێدا ڕوونادات.

٢ – کاتێك پیتی (یّ) و ( وّ ) دوانە (شدە) لەسەر بوو پاڵە پەستۆ دەخەینە سەر پیتی (یّ) و ( وّ ).

**نموونە:** سَيَّارَةٌ = سەييارِەتون

قُوَّةٌ= قو ووە تون

٣ – كاتێك بزوێنی درێژی (ا) دەگات بە پیتی دوانە(شد)

**نموونە:** رَآدَّ = رااااادده

ضَآلِّينَ= ضاااااللييينە

٤ – كاتێك بە پیتی همزە (ء) كۆتايی دێت رادەوەستين.

**نموونە:** سُوَءٌ=سووووء

سَمَآءٌ= سماااااء

٥ – لەکاتی لاچونی ئەلیفی دووانە(الف التثنیە) یان واوی کۆ (واو الجماعە) بـــۆ خۆڕزگارکردن لە بەیەك گەیشتن دوو زەنەدار ئەگەر لەکاتی دەڕبریندا وەك (مفرد) بوترێت،ئەویش لە:

١- ( ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ ) الأعراف ٢٢.

٢- ( وَٱستَبَقَا ٱلۡبَابَ) یوسف ٢٥.

٣- ( وَقَالَا ٱلۡحَمدُ لِلَّهِ) النمل ١٥.

٤- (وَصَالِحُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ) التحریم ٤.

تێبینی : لە تێبینیەکانی بەشی (١) باسی ئەوە دەکەین کاتێك بزوێنی درێژ یان (ی) درێژ یان (و) درێژ دەگات بەهەمزەی پەیوەندی (ٱ) بزوێنی درێژ دەبێت بەبزوێنی کورت وە (ی) درێژ دەبێت بە(ی) کورت وە (و) درێژ دەبێت بە (و) کورت.

# وانەی حەوتم

## سکتە

سکتە: واتا گرتنەوەی هەناسە لەکاتی هاتنی نیشانەی(س) لەسەر چەند وشەیەێکی ناو قورئان پێویستەهەناسە بگریتەوە کاتێك دەگەین بە نیشانەی (س).

**نمونە:**

١- (....... عِوَجًا (1) قَيِّمًا.......) سورة_الكهف.

٢- (وَقِيلَ مَنْ رَاقٍ (٢٧) ....) سورة_ القيامة.

٣- (... من مَّرْقَدِنَا هَٰذَا مَا ....) سورة_يس (٥٢).

٤-(.. كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ ..)سورة_المطففين (١٤).

تێبینی :لە ئایەتی سورة الحاقة هەمانە نیشانە هاتووە بەڵام دەتوانین هەناسە بگرینەوە وە دەتوانین هەناسە نەگرینەوە و تێکەهەڵکێش(إدغام) بکەین ، تێبینی لەبەشی دووەم باسمان کردووە لە وانەی دووەم.

(مَآ أَغْنَىٰ عَنِّي مَالِيَهْ (٢٨) هَلَكَ عَنِّي سُلْطَٰنِيَهْ (٢٩))سورة_الحاقة.

# وانەی هەشتەم

چۆنیەتی ڕاهێنان کردن بۆ گشت یاساکان کە تا ئێستا خوێندوتە بە شێوازێکی دێرە شەعریانە کە هاوکریت دەکات لە باشترکردن لە کاتی قورئان خوێندنەوەت

١- ءَا إِي أُو بَأْ أُو أَ أَنِ أًّ أَأْنَ مِنَ ٱلْمُؤْنِ مَئِياً أَنِءاً

٢- بَا بِي بُو بَبْ بُو بَاً بَنِ بَبْنَ مِنَ ٱلْمُبْنِ مَبِيباً بَنِباً

٣- تَا تِي تُو بَتْ تُوتاً تَنِ تَتْنَ مِنَ ٱلْمُتْنِ مَتِيتاً تَنِتاً

٤- ثَا ثِي ثُو بَثْ ثُوثاً ثَنِ ثَثْنَ مِنَ ٱلْمُثْنِ مَثِيثاً ثَنِثاً

٥- جَا جِي جُو بَجْ جُوجاً جَنِ جَجْنَ مِنَ ٱلْمُجْنِ مَجِيجاً جَنِجاً

٦- حَا حِي حُو بَحْ حُوحاً حَنِ حَحْنَ مِنَ ٱلْمُحْنِ مَحِيحاً حَنِحاً

٧- خَا خِي خُو بَخْ خُوخاً خَنِ خَخْنَ مِنَ ٱلْمُخْنِ مَخِيخاً خَنِخاً

٨- دَا دِي دُو بَدْ دُو داً دَنِ دَدْنَ مِنَ ٱلْمُدْنِ مَدِيداً دَنِداً

٩- ذَا ذِي ذُو بَذْ ذُو ذاً ذَنِ ذَذْنَ مِنَ ٱلْمُذْنِ مَذِيذاً ذَنِذاً

١٠- رَا رِى رُو بَرْ رُو راً رَّنِ رَرْنَ مِنَ ٱلْمُرْنِ مَرِيراً رَنِراً

١١-زَا زِى زُو بَزْ زُو زاً زَنِ زَزْنَ مِنَ ٱلْمُزْنِ مَزِيزاً زَنِزاً

١٢-سَا سِى سُو بَسْ سُو ساً سَنِ سَسْنَ مِنَ ٱلْمُسْنِ مَسِيساً سَنِساً

١٣-شَا شِى شُو بَشْ شُو شاً شَنِ شَشْنَ مِنَ ٱلْمُشْنِ مَشِيشاً شَنِشاً

١٤-صَا صِى صُو بَصْ صُوصاً صَنِ صَصْنَ مِنَ ٱلْمُصْنِ مَصِيصاً صَنِصاً

١٥-ضَا ضِى ضُو بَضْ ضُو ضاً ضَنِ ضَضْنَ مِنَ ٱلْمُضْنِ مَضِيضاً ضَنِضاً

١٦-طَا طِى طُو بَطْ طُو طاً طَنِ طَطْنَ مِنَ ٱلْمُطْنِ مَطِيطاً طَنِطاً

١٧-ظَا ظِى ظُو بَظْ ظُو ظاً ظَنِ ظَظْنَ مِنَ ٱلْمُظْنِ مَظِيظاً ظَنِظاً

١٨-عَا عِى عُو بَعْ عُو عاً عَنِ عَعْنَ مِنَ ٱلْمُعْنِ مَعِيعاً عَنِعاً

١٩-غَا غِى غُو بَغْ غُو غاً غَنِ غَغْنَ مِنَ ٱلْمُغْنِ مَغِيغاً غَنِغاً

٢٠- فَا فِى فُو بَفْ فُو فاً فَنِ فَفْنَ مِنَ ٱلْمُفْنِ مَفِيفاً فَنِفاً

٢١- قَا قِي قُو بَقْ قُو قاً قَنِ قَقْنَ مِنَ ٱلْمُقْنِ مَقِيقاً قَنِقاً

٢٢- كَا كِي كُو بَكْ كُو كاً كَنِ كَكْنَ مِنَ ٱلْمُكْنِ مَكِيكاً كَنِكاً

٢٣-لَا لِي لُو بَلْ لُو لاً لَّنِ لَلْنَ مِنَ ٱلْمُلْنِ مَلِيلاً لَنِلاً

٢٤- مَا مِي مُو بَمْ مُ ماً مَنِ مَمْنَ مِنَ ٱلْمُمْنِ مَمِيماً مَنِماً

٢٥- نَا نِي نُو بَنْ نُو ناً نَنِ نَنْنَ مِنَ ٱلْمُنْنِ مَنِيناً نَنِناً

٢٦-وَا وِي وُو بَوْ وُو واً وَنِ وَوْنَ مِنَ ٱلْمُوْنِ مَوِيواً وَنِواً

٢٧- هَا هِي هُو بَهْ هُو هاً هَنِ هَهْنَ مِنَ ٱلْمُهْنِ مَهِيهاً هَنِهاً

٢٨-يَا يِي يُو بَيْ يُو ياً يَنِ يَيْنَ مِنَ ٱلْمُيْنِ مَيِيياً يَنِياً

إِخْفَاءْ (شاردنەوە) :

إِظْهَارْ (دەرخستن) :

إِقْلَابْ (هەلگەڕانەوە) :

إِدْغَامْ بِلَاغُنَّة (تێکهەلکێشکردنً بەبێ مینگە) :

إِدْغَامْ بِغُنَّة (تێکهەلکێشکردنً مینگە) :

# وانەی نۆیەم

## چەندوشەیەکی تایبەت لە قورئاندا

١- لە سێ وشەدا لە قورئاندا پیتی (ص) پیتی (س) لەژێرە یان لەسەرە.

أ- کاتێك لەسەرەوە لەسەری بوو پێویستە بە پیتی (س) بیخوێنیتەوە پیتی (ص) کە نموون:

١-(.. وَيَبۡصُۜطُ ⟵ وەییبسوطو) سورة_البقرة (٢٤٥).

٢-(.. بَصۜۡطَةٗ ⟵ بەسطەتەن) سورة_الأعراف (٦٩).

ب- کاتێك لەژێرەوە پیتی (ص) یان پیتی (س) هات دەتوانی بە (ص) یان بە (س) بیخوینیتەوە بەڵام خوێندنەوەی بە پیتی (ص) بەناوبانگترە. نموون:

٣-(.. ٱلۡمُصَيۡطِرُونَ ⟵ (ئەلموصەیطیروونە) یان (ئەلموسەیطیروونە)) سورة_الطور (٣٧).

٢- وشەی ( تَأْمَنَّا ) سورەتی یوسف هاتووە دوو شێوەی خوێندنەوەی هەیە :

أ- ( تَأْمَنَّا )= (تَأْمَنُنَا ) =تەئمەنونا–بەڵام بیرت بێت پیتە(نُ)کە نیشانەی (و) کورتی (ضمه) لەسەرە دەبێ بەخێرایی بوترێ.

ب- ( تَأْمَنَّا )= (تَأْمَنَّا ) =تەئمەننا–بەڵام بیرت بێت کاتێك گەیشتی بە پیتە(نّ)کە نیشانەی دوانە (شد) لەسەرە دەبێت لە لێوەکانت خڕکەی.

٣- وشەی ( ءَاتَىٰنِۦَ ) لە ئایەتی (٣٦) لەسورەتی (النمل) ئەگەر ڕاوستاین یان لەسەری ڕۆیشتین خوێندنەوەی جیاوازە :

أ- کاتێك ڕۆیشتین لەسەر وشەی ( ءَاتَىٰنِۦَ )
(ءَاتَىٰنِۦَ ٱللَّهُ)-(ئاتانیە ڵڵاهو).

ب- کاتێك ڕادەوەستین لەسەر وشەی ( ءَاتَىٰنِۦَ )
(ءَاتَىٰنِۦَ)- (ئاتانیی) یان دەتوانین بڵێین(ئاتان).

٤-وشەی (ءَاْعْجَمِيٌّ) لة ئایةتی [٤٤] سورەی فصلت خوێندنەوەکەی دەڵێن(ئەئەعجەمیی).

# وانەی دەیەم

## چۆنیەتی دەست پێکردنی قورئان خوێندنەوە

هەرکاتێك قورئانت خوێندەوە دەبێت پەنا بگریت بە خوای گەورە.

**فَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ (٩٨) سورة _النحل.**

١-خوێندنەوەی بڕگە بڕگە دەتوانی بلێیت(أَعُوذُ بِٱللهِ مِنَ ٱلشَّيْطَانِ ٱلرَّجِيمِ) ڕاوەستی دواى بلێیی (بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ) ڕاوەستی دواى بلێیی(ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ) .

٢-خوێندنەوەی بڕگەی یەکەم ڕاوەستان وە خوێندنەوەی دوو بڕگە لەسەر یەك دەتوانی بلێیت (أَعُوذُ بِٱللهِ مِنَ ٱلشَّيْطَانِ ٱلرَّجِيمِ) ڕاوەستی دواى بلێیی(بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ (١) ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ (٢).

٣-خوێندنەوەی هەموو بڕگەکان بەیەکەوە دەتوانی بلێیت(أَعُوذُ بِٱللهِ مِنَ ٱلشَّيْطَانِ ٱلرَّجِيمِ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ (١) ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ (٢)

تێبینی:- نابێت بلێی(أَعُوذُ بِٱللهِ مِنَ ٱلشَّيْطَانِ ٱلرَّجِيمِ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ) پاشان ڕاوەستی یان دەبێت بەجیان بخوێنیتەوە یان ئایەتێك دواى (بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ) بخوێندرێت.

# وانەی یانزەم

## هێماکانی قورئان



# وانەی دوانزەم

## تەجوید

### تەجوید چیە :

تەجوید لە فەرهەنگی زمانی عەرەبیدا واتە جوانکردن یاخود چاککردن.وە تەجوید لە فەرهەنگی زانایانی تەجوید بریتیە لەو زانستەی کە بە هۆیەوە دەتوانی هەموو یاساکان و سیفەتی پیتەکان و شوێنی دەرجوونی پیتەکان و درێژکردنەوە و وەستان و دەستپێکردنەوە بەباشی بەبێ هیچ زیادە و کەمێك کە لە وانەکانی پێشوو باسمان کردن یاخود دەتوانین بڵێین تەجوید بریتیە باش خوێندنەوەی وشەکانی قورئان وەك جۆن وەرگیراو لە پێغەمبەرمان محمد (صل الله علیه وسلم) وە دووربوون لە هەڵەکردن لە پەرتووکی الله .وە حوکمی تەجوید بریتیە لە فەرزی کیفایە کە کۆمەڵێك موسوڵمان شارەزابن لەسەر موسوڵمانانی تر لادەچێ.

# تێبینیەكان

١- دەرخستن و هەڵگەڕانەوە و شاردنەوە لە یەک وشە یان دوو وشە ڕوودەدا بەڵام لە تێکهەلکێشکردن تەنها لە دوو وشەدا ڕوودەدات.

٢.ئەو پیتانەی کە لەسەرەتای قورئاندا دێن شاردنەوە (إخفاء)و تێكهەلكێشكردن(إدغام) تێیاندا ڕوودەدات

أ-نموونە بۆ شاردنەوە (إخفاء)

كٓهيعٓصٓ (١) سورة مريم خوێندنەوەکەی دەڵێن (کاااااف ها یا عیییییین صاااااااد)

كاتێك پیتی كۆتای وشەی (عەین)دەگات بە پیتی یەكەمی وشەی(صاد) شاردنەوە (إخفاء) ڕوودەدات بەهەمان شێوە كاتێك لە سورة الشورى(عٓسٓقٓ (٢) دەڵێن(عەییییییین سییییییین قااااااف)كاتێك پیتی كۆتای وشەی (عەین)دەگات بە پیتی یەكەمی وشەی(سین) وە كاتێك پیتی كۆتای وشەی (سین)دەگات بە پیتی یەكەمی وشەی(قاف) شاردنەوە (إخفاء) ڕوودەدات

ب-نموونە بۆ تێكهەلكێشكردن(إدغام) بە دوو شێوە دێت

یەکەمیان-کاتێك دوو پیتی هاوشێوەی یەک دێت تێکهەڵکێشکردن (إدغام) روودەدات وە تەنها پیتی (م) هەیە
لە سُورَة البقرة و آلِ عِمْرَان و الأعراف و الرَّعْد
(الٓمٓ )(١) سُورَة البقرة و آلِ عِمْرَان
دەڵین(ئەلیف لاااااًمیییییم)
(الٓمٓصٓ)(١) سُورَة الأعراف
دەڵین(ئەلیف لاااااًمیییییم صاااااد)
(الٓمٓر)(١) سُورَة الرَّعْد
دەڵین(ئەلیف لاااااًمیییییم را)
پیتی کۆتای (لام) وە پیتی یەکەمی(میم)
تێکهەلکێشکردن(إدغام)دەکەین باسی ئەمجۆرە تێکهەلکێشکردن (إدغام) کردوا لە بەشی دوو وانەی ٣
دووەمیان- تێکهەلکێشکردن(إدغام) کاتێك نونی زەنەدار(نون ساکنە)دەگات بە پیتی (م) لە سورة الشُعَرَاء (طسٓمٓ) دەڵین
(طا سییییین مّیییییم) = (طا سییییییمّیییییم).

سێ یەمیان-کاتێك دەمانەوێت ئایەتی یەکەم و دووەمی سورِەتی (آلِ عِمْرَان) بخوێنینەوە لەسەریەك پیتی (م)کە (الٓمٓ) کە دەبێت شەش جوڵە درێژی کەینەوە(مییییییم) بەڵام کاتێك لەسەریەك ئایەتی یەکەم و دووەمان خوێندەوە پیتی(م)ەکە دوو جوڵە درێژ دەکەینەوە و پیتی(م)ەکە سەرە(فتح)وەردەگرێ جونکە دوو زەنەدار(سکون)کونابێتەوە دەڵین(ئەلیفلاااااامییمەڵڵاهو ..).

چوارەم :تێبینی تێبینیەکان ئەویش بابەتي (ئیشمام و ڕەوم)ە کە لە ڕاوەستاندا و ڕۆشتن.

لە ڕاوەستان

أ-ڕەوم(الرّوم):نزم کردنەوەی دەنگ لەکاتێ کۆتای پیتی وشە نیشانەی (بۆرە-ضمە) یاخود (ژێرە-کسر) هات کە بەشێوەیێك دەنگەکە زۆربەی ئەڕوات یاخود نامێنێ
نموونە (نَسْتَعِينُ)-(مَِلِكِ)-
وەکاتێك پیتی کۆتایی دوو بۆرە(ضمتین)یان دوو ژێرە(کسرتین) لە دوو بۆرە(ضمتین) تەنها بۆر(ضمە) لە دوو ژێرە(کسرتین) تەنها ژێرە(کسر) دەمێنێتەوە وە بەشێکی کەم لە بۆر(ضمە) و ژێرە(کسر دەڵین:
نموونە: (حَكِيمٌ)(مُ) (حَاسِدٍ)(دِ).

ب-ئیشمام(الإشمام):خڕکردنی هەردوو لێو لە دوای زەنەدارکردنی(سکون) پیتی کۆتای وشەکە کاتێك بە نیشانەی(بۆرە-ضمە) هەبوو بەڵام بەبێ دەنگ واتا بۆرە(ضمە) دەڵین بەڵام هیچ دەنگێك دەرناچێ وە کەسێکی نابینا هەست پێناکا
نموونە (نَسْتَعِينُ) (أَلِيمٌ)

## له كاتی ڕۆشتن

أ-   ڕەوم(الرّوم):

نموونە:

(ٱلۡقَدۡرِ )=لەكاتی ڕاوەستان و ڕۆشتن پیتی(ر) بەلاواز دەخوێنینەوە

(فَيَغۡفِرُ) لەكاتی ڕاوەستان و ڕۆشتن پیتی(ر) بە قەڵەو دەخوێنینەوە.

ب-ئیشمام(الإشمام):

(فَيَغۡفِرُ) لەكاتی ڕاوەستان (فەیەغفیر)و ڕۆشتن (فەیەغفیڕ) ئەم بابەتە (ئیشمام و ڕەوم) من بەشێوەیكی كورت باسی دەكەم جونكە زۆر لە قورئان خوێنان بەكاری ناهێنن وە زۆرێك لە خەڵك كاتێك گوێیان لە ئەم بابەتە دەبێ وەك شتێكی نامۆ بۆیان وایە بەڵام لەڕاستیدا ئەم بابەتە زۆر گرنگە بۆ بابەتی ڕێزمان و قوتابیە سەرەتاییەكان كاتێك قورئان فێردەبن.



هەر رەخنە و پێشنیارێك



هەر كەسێك دەیهەوێت ئەم نامیلكەیەی بە PDF
دەست بكەوێت با پێوەندیمان پێوە بكات



هەر كەسێك ویستی هاوكاریمان بكات
لە چاپكردن و بڵاوكردنەوەیدا



٠٧٥٠ ٢٤٢ ٢٥٨٢








Salman Abdulla Qadir




فێربوونی چۆنیەتی قورئان خوێندنەوە




چۆنێتی فێربوونی قورئان خوێندنەوە

